


# من وصايا السلف للشباب

## بەکوردی



نووسین و ئامادەکردنی

عبد الرزاق بن عبد المحسن البدر

وەرگێرانی

دڵدار نەجات شێروانی

ناوی کتێب: لە ئامۆژگارییەکانی پێشینان بۆ گەنجان

بابەت: ئایینی

نووسینی: شێخ عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

وەرگێڕانی: دلدار نەجات شێروانی

پێداچوونەوەی: مامۆستا هێوا حمد میرەکانی

بەرگ و نەخشەسازی ناوەوە: یوسف عبدالله حمد

ڕێکخستنی بابەتەکان: سەردار عەلی مەجید

چاپ: یەکەم (١٤٤٤ - ٢٠٢٢) هەولێر



## پێشەکی دانەر

# بِسْــــمِ اللهِ الــرَّحْمنِ الــرَّحِيم

الْحَمْـــــدُ للهِ رَبِّ العالَــــمِينْ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاإلـهَ إلا اللَّهُ وَحْـدَهُ لا شَرِيکَ لَه وَ أَشــهَدُ أَنَّ مُحمَداً عَبدُهُ وَرَسُولُــــــهْ ، صَلَّى اللَّهُ عَليهِ وَعلى آلــــــهِ وَ أَصْحابِـهِ أَجْمَعينْ .

پاشان :

شتێکی شاراوە نیە کەوا قۆناغی گەنجیەتی قۆناغێکی زۆر گرنگە لەژیانی مرۆڤ ؛ لەبەر ئەوەی قۆناغی هێز و چاڵاکی ، و ئاسانی جووڵە ، و بەهێزی ئەندامەکان ، و سەلامەتی هەستەوەرەکانە ( چاو و گوێ و لووت و دەم ) ، لەکاتێکدا ئەگەر مرۆڤ پیر بوو هەستەوەرەکانی لاواز دەبن و خۆشی بێ هێز دەبێ .

ئیسلام گرنگیەکی تایبەت و چاودێریەکی گەورەی بەم قۆناغە داوە دەقەکان کەهاتوون تەئکیدیان کردۆتەوە لەسەر گەورەیی و گرنگی ئـەم قــۆناغە ، پێغەمبەری خـــوا صلى الله عليه و سلم هـــانی داوین

دەست پێشخەری بکەین بۆ  قۆزتنەوەی ئەم قۆناغە ، و ئاگاداری کردوینەتەوە بەفیڕۆی نەدەین .

لە ئیبن عەبباسەوە ڕەزای خوا لەخۆی و باوکی فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئامۆژگاری پیاوێکی دەکرد  پێ ی فەرموو : ( إغتَنمْ خَمسًا قَبلَ خَمسٍ : شَبابَك قَبلَ هَرَمِكَ وصَحَّتَكَ قَبلَ سَقمِكَ ، وَغناكَ قَبل فَقْرِكَ ، وَفَراغِكَ قَبلَ شُغلِكَ ، وحَياتِكَ قَبلَ مَوتِكَ )[1].

واتە : ( پێنج شت پێش پێنج شت بقۆزەوە : گەنجیەتیت پێش پیریت ، لەش ساغیت پێش نەخۆشیت ، دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت ، دەست بەتاڵیت پێش سەرقاڵیت ، ژیانت پێش مردنت ) .

قۆناغی گەنجیش هەر دەچێتە ناو کۆی وتەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم : (حياتَك قَبْلَ مَوتِك) ؛ لە بەر گەورەیی بایەخەکەی و پلە و پێگەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەتایبەتی باسی ئەم قۆناغەی کردووە ، بۆیە پێویستە بەئاگابین لەو قۆناغە و کەمتەرخەمی تێدا نەکەین .

---

١ ) أخرَجَهُ الحاكِم في (المُستَدرَک) رقم (٧٨٤٦) ، وصَحَحَهُ ، ووافَقَهُ الذَهَبي ، وصَحَحَهُ الألباني في (الجامع) (١٠٧٧).

لەئیبن و مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( لا تَزُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَدَمَا عَبْدٍ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ وَعَنْ جَسَدِهِ فِيمَا أَبْلاهُ وَعَنْ عِلْمِهِ مَاذَا عَمِلَ فِيهِ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ أَخَذَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ ) .[٢]

واتە : ( لەڕۆژی دوای پێ یەکانی نەوەی ئادەم لەلای پەروەردگار ناجولێنرێن تاوەکوو پرسیاری دەربارەی چوار شت لێ نەکرێ : لەتەمەنی ؛ لەچیت بەسەر برد ، لەگەنجیەتی ؛ لەچیت بەڕێ کرد ، لەماڵەکەی ؛ لەکوێ ی بەدەست هێناوە و لەچی بەخشی ، چیت بەو زانستە کرد کەفێری بووی ) .

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی پێداوین لەڕۆژی دوای بەندە دوو پرسیاری لێدەکرێ دەربارەی ژیانی :

یـــەکەم : دەربـارەی ژیانی بەشێوەیەکی گشتی لەسەرەتای تاکۆتای

دووەم : دەربارەی قۆناغی گەنجیەتی بەتایبەتی ، لەگەڵ ئەوەی کاتێ پرسیاری ژیانی لێدەکرێ قۆناغی گەنجیش دەچێتە ناو ئەو قۆناغە ؛ بەڵام ڕۆژی دوای ئەم قۆناغە پرسیاری تایبەت بەخۆی لەبارە دەکرێ

---

[٢]- أخرَجَهُ الترمُذي برَقم (٢٤١٦) ، وصَحَحَهُ الألباني في (الصَحيحَة) (٩٤٦).

لەبەرئەوە پێویستە لەسەر گەنج لەبەر گرنگی ئاگاداری ئەم قۆناغە بێ ، بەردەوام لەبیری بێ کەوا پەروەردگار ڕۆژی دوای پرسیاری لێدەکا چ کردەوەیەکت کرد لەم قۆناغە ، جگەلەوەی پرسیاری کردەوەکانی ژیانی بەگشتی لێدەکرێ ، چونکە قۆناغی گەنجیەتی قۆناغی هێز و چالاکی ، و ئاسانی جووڵە ، و بەهێزی ئەندامەکان ، وکاملّی هەستەوەرەکانە .

لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هانی گەنجان دەدا ـ وەک لە فەرموودەکەی پێشووتر ـ ئەم قۆناغە بەچاکی بقۆزنەوە .

وە هەروەها فەرمان بە زانایان و ئەوانەی گرنگی بەپەروەردە و فێربوون دەدەن دەکات کەوا گرنگی بەگەنج بدەن ؛ چونکە گەنج پێویستی بەگرنگی پێدان و ناز ، و نەرم و نیانی ، و خۆشەویستی هەیە ، پێویستی بەوەیە کردەوەی چاکی لەلا خۆشەویست بکرێ ، تاکوو گومڕاکاران و ئەوانەی خەڵک لەسەر قەدەغەکراوەکان پەروەردە دەکەن نەیان فڕێنن .

لەبەرئەوە هاوەڵان پێداگربووینە لەسەر هێنانەدی ئەو ئامۆژگاریەی پێغەمبەری خوا ، هەروەک لەئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە کاتێ گەنجی بدیبایە دەیفەرموو : ( بەخێربێ ی بۆ ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ؛ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئامۆژگاری کردووین جێگاتان بــــۆ فراوان کەین لــەکۆڕ و مەجلیس ؛ و تێتان

بگەیەنین لەفەرموودە ؛ ئێوە جێگرەوەی ئێمەن ؛ دوای ئێمە ئێوە فەرموودە دەگێڕنەوە )[٣]، هەروەها ڕووی لە گەنج دەکرد و پێ ی دەیفەرموو : ( ئەی کوڕی برام ؛ ئەگەر گومانت بۆ دروست بوو لەشتێ پرسیارم لێ بکە تا دڵنیا دەبی ؛ ئەگەر لەسەر یەقینەوە بڕۆی لەلام خۆشترە لەوەی لەسەر گومان بڕۆی )[٤]؛

عبداللّٰه کوڕی مەسعود کاتێ گەنجانێکی بدیبایە داوای زانست دەکەن دەیفەرموو : ( سڵاو لەو کەسەی کانگای زانستە ، و چرای تاریکیە ، و جلی کۆنن و دونیا نەویستە ، و پەیوەستە بەماڵەوە لەبەر زانست ، و شەوەکانی بەشەونوێژ ڕووناک دەکاتەوە ، زۆر تەوبە و إستغفار دەکا ، و ڕەیحانەی هەموو خانەوادەیەکە ).[٥]

ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان و گرنگی دانیان بەو قۆناغە گەلێ زۆرە ، لەم نامیلکەیە ( لەئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان ) گوڵ بژێرێکم کردووە ، و لەگەڵ هەر ئامۆژگاریەکیش توانجێکی کورتم لەسەر داوە .

---

[٣] - واتە : دەبنە شوێنگرەوەی ئێمە لەفێرکردنی خەڵک و بانگیان دەکەن بۆ بەرنامەی خوای گەورە .

[٤] - أخرَجَهُ البَيهقي في كِتابِه (شُعَبُ الإيمان) برقم (١٦١٠) .

[٥] - أخرَجَهُ إبْن عَبدُالبُر في (جامع بيان العلم و فضله) برقم (٢٥٦) .

سەرچاوەی دانانی ئەم نامیلکەیە موحازەرەیەک بوو کەلەمەملەکەتی بەحرێن پێشکەشم کرد لە (١٣) جەمادی یەکەمی ساڵی ١٤٣٥ کۆچی ، لەمزگەوتی (حمد) لەگەڕەکی (المحرق) ، پاشان پێداچوونەوەم بۆ کرد و هەندێ سوودی ترم بۆ زیادکردوو ، و لەم نامیلکەیەدا کۆم کردەوە ، خوای گەورە پاداشتی زۆر بەخێری هەموو ئەو کەسانە بداتەوە کەوا بەشداربوون لەکۆکردنەوەی .





# ئامۆژگاری یەکەم

باوکی ئەحوەص فەرمووی : باوکی ئیسحاق کە "عەمرِی سەبیعی" یەفەرموویەتی : ( ئەی کۆمەڵی گەنجان تەمەنی گەنجیەتیتان بەهەڵ بقۆزنەوە ، بەخوا کەم شەو هەیە بەسەرمدا تێ پەڕێ ئیلا هەزار ئایەتی تێدا دەخوێنم ، وە سورەتی (البَقَرَة) لەیەک ڕکات دا دەخوێنم ، وە هەموو مانگە حەرام کراوەکان ( رَجَب ، ذوالعقدة ، ذوالحجة ، المُحرم) بەڕۆژوو دەبم ، وە سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێگ بەڕۆژوو دەبم ، وە (دووشەم) و (پێنج شەم) ی هەموو مانگێک بەڕۆژوو دەبم ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە )[1].

{ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ } [سُورَةُ الضُّحَىٰ: ١١] .

واتە : ( نیعمەت و بەخششی پەروەردگارت دەربخە بەیارمەتیدانی هەژاران ) .

---

[1] أَخرجَهُ الحاكَم في (المُسْتَدرَك) برقم (٣٩٤٧).



کاتێک کەدەڵێ : ( هەزار ئایەت لەشەوێکدا دەخوێنم ) مەبەستی پێ ی بەنزیکەی ئەوەندە ئایەتە دەخوێنێ نەک بەدیاری کراوی ، مانای ئەوەیە هەموو هەفتەیەک جارێک قورئان خەتم دەکات ، وە هەموو هەفتەیەک جارێک قورئان خەتم کردن ڕێچکە و ڕێبازی هەموو پێشینان بووە .

دەربارەی عەمرِی کوڕی مەیمونەوە هاتووە کەوا هەرکاتێک بگەیشتبایە یەکێک لەبرا موسڵمانەکانی دەیفەرموو : ( شەوی ڕابردوو خوای گەورە ڕێزی لێنام ئەوەندە ڕکات شەو نویژ و ئەوەندە خێر و چاکەشی پێ بەخشیم )[٢].

باوکی عبداللّه حاکم لە ( مُستَدرَک الحاکِم ) دوای ئەوەی ئەم دوو ئەثەرەی پێشووی لە ( مُستَدرَک )ە کەکەی هێناوە ، دەفەرمووێ (ڕەحمەتی خوا لەعەمرِی کوڕی عوبەیدوڵای سەبیعی و عەمرِی کوڕی مەیمونی ئەل ئەودیەیی ؛ بەڕاستی ئاگاداریان کردینەوە لەو شتانەی کەوا پاڵ بەگەنجانەوە دەنێ بۆ عیبادەت کردن ) .

هەروەها لەسوودەکانی ئەم دوو ( أثَرَ )ە ئەوەیە :

پەروەردەکردنی گەنجان کەیەکێک بکات بەپێشەنگی خۆی لە چـــاکەکاریدا ، بۆئەوەی گەنج گورج و گـــۆڵ بێ بۆ عبادەت کردن و

---

[٢] - أخرَجهُ الحاكم في (المُستَدرَك) برقم (٣٩٤٨) .







گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەش لەسەری ئاسان بێ پێویستە پەروەردە بکرێ بەوەی سەیری کەسانی پێشەنگ بکات لەخواپەرستیدا ، بەڵام پێویستە لەسەر مامۆستاش زۆر ئاگاداری نیەت و مەبەستی خۆی بێ ؛ تاوەکوو نەکەوێتە ناو ڕووپامایی و ڕیاء و کردەوەکەی پووچەڵ ببێتەوە .







# ئامۆژگاری دووەم

لـە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

حەممادی کوڕی زەید دەفەرمووێ : چووینە لای ئەنەسی کوڕی سیرین لەکاتی نەخۆشیەکەی فەرمووی : ( لەخوا بترسن ئەی کۆمەڵی گەنجان ، سەیرکەن و بزانن لەچ کەسێک ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم وەردەگرن و فێری دەبن ؛ چونکە ئەوە لەدینەکەتانە )[٣].

ئەوە ئامۆژگاریەکی زۆر گەورەیە ، کە بریتیە : ئەو گەنجەی ڕووی لەداواکردنی زانستی شەرعی و بەدەستهێنانی فەرموودەیە ؛ پێویستە لەسەر دەستی زانایانی ڕۆچوو لەزانستی شەرعی و ڕاگیرا و چەسپا و زانست وەربگرێ ، ئەوانەی پسپۆڕن و بەرچاو ڕوونن و لەناو زانستی شەرعی دا گەورەبووینە ، نابێ زانست لەهەموو کەسێک وەربگرێت ؛ بەڵکوو زانست لەکەسی ئەهلی سوونەت و جەماعەت وەربگرێت ئەوانەی ڕۆچووینە لەناویدا .

---

[٣] - أَخرَجَهُ الخَطيب في (الجامِعُ لِأَخلاقِ الرَّاوي وَآدابِ السّامِع) برقم (١٣٩).





ئیبن و شەوذەب ڕەحمەتی خوای لێ بی فەرموویەتی : ( بەڕاستی لە بەخششەکانی پەروەردگار لەسەر گەنج ئەوەیە کاتێ دەستی دایە خواپەرستی پێویستە هاوڕێ یەتی خاوەن سوننەت بکات ؛ بۆ ئەوەی فێری سوننەتی بکات و شوێنی سوننەتی پێ نیشان بدات ) .

عەمرِی کوڕی قەیسی ئەل مولائی فەرموویەتی : ( ئەگەر بینیت گەنجێک سەرەتای پێگەیشتن و گەشەسەندنی لەگەڵ کەسانی ئەهلی سوونە وجەماعەت بوو ئەوا ئومێدی چاک و خێرت پێ ی هەبێ ، وە ئەگەر بینیت سەرەتای گەشە و پێ گەیشتنی لەگەڵ ئەهلی بیدەع و لاڕێ یان بوو بێ ئومێد بە لێ ی ، چونکە بەڕاستی گەنج لەسەر یەکەم پێ گەیشتنیەتی ) .

هەر لەعەمرِی کوڕی قەیسی مولائی یەوە هاتووە : کەوا فەرموویەتی : ( بەڕاستی گەنج کاتێک کە پێ ڕادەگا و گەشەدەکات ، ئەگەر کۆڕوو کۆبوونەوەی ئەهلی سوونەت و جەماعەتی هەڵبژارد نزیکە سەلامەت دەرچێ ، وە ئەگەر لایدا لەکۆڕوو کۆبوونەوەی ئەهلی سوونەت و جەماعەت نزیکە تیابچێ ) [٤].

---

[٤] - أَخرَجَهُ الآثار المُتَقَدِمَة إبنْ بَطة في (الإبانَة الكُبرى) (٢٠٤/١ رقم : ٤٢ –٤٤).





# ئامۆژگاری سێیەم

لـــە مالیکی کوڕی دینارەوە هاتووە ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرموویەتی : ( بەڕاستی هەرچی خێر و چاکە هەیە لە گەنجایەتیدایە )[٥].

ئەوە بێدارکردنەوەیەکی گەورەیە لەلایەن مالیکی کوڕی دینارەوە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ ، لەبەر گرنگی ئەم قۆناغە ، بەڕاستی ئەگەر گەنج بەچاکترین شێوە قۆناغی گەنجیەتی خۆی بقۆزێتەوە خێرێکی زۆر گەورەی بەدەست هێناوە ، ئەو خێرە گەورەش کە لە تەمەنی گەنجیەتیدا بەدەستی هێناوە دەبێتە کۆڵەگە و پاڵپشتێکی بەهێز و چەسپا و بۆی ، و لەگەڵی دەمێنێتەوە تامردن ؛ سوود و قازانج بەخۆیی و گەلەکەی دەگەیەنێ ، وە دەبێتە ئامۆژگاریەکیش بۆ خەڵکان ، لەکاتێکدا ئەگەر بەچاکی قۆناغی گەنجیەتی هەڵ نەقۆزێتەوە ؛ ئەوا خێر و بەرەکەتی ئەو قوناغەی لـــەکیس دەچێ .

کاتێک کە هێز و توانا و کات و سەروەت و سامان لەدەستی گەنج کۆببنەوە دەبنە هۆی لەناوبردنی .

---

[٥] - أخرَجَهُ الخَطِيبُ في (الجامَعْ لِأَخْلاقِ الرَّاوي وَآدابِ السَّامِعْ) (٦٧٣).





هەروەک وتراوە ؛

بەڕاستی گەنجایەتی و دەست بەتاڵی و دەوڵەمەندی

خراپ کەری مرۆڤن چ خراپ کردنێک خراپی دەکەن !

جا کاتێک هێز و توانای گەنجیەتی و دەست بەتاڵی و ماڵی دونیا و چوارەم شتیش کەفیتنە و ئاشووبی زۆرە پێکەوە لەدەوری گەنج کۆبوونەوە ، فیتنە و ئاشووبیش نزیک بوو لێ ی ، و دەرگاکانی چوونە ژوورەوەشی زۆر بوون ئەوا گەنج لەناو دەبەن .

ئەو چوار شتە لەگەورەترین لەناوبەرەکانی گەنجن کەوا بەهۆیانەوە تووشی تاوان و سەرپێچی زۆر گەورە دەبێ لەتەمەنی گەنجیەتی دا ، وە خێر و بەرەکەتی گەنجیەتی لەدەست خۆی دەدا .

مالک کوڕی دینار کە دەفەرمووێ ( بەڕاستی هەرچی خێروو چاکەیە لەتەمەنی گەنجیدایە ) ، بۆیە وادەڵێ تاوەکوو وریابین لەوەی خێر و بەرەکەتێکی زۆر گەورە لەو قۆناغەدا هەیە ئەگەر خوای گەورە گەنج مۆفەق بکات و یارمەتی بدات لەسەر قۆزتنەوەی ئەو قوناغە لەو شتانەی کەوا خۆی پێ ی ڕازیە .







# ئامۆژگاری چوارەم

لـــە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

زەیدی کوڕی ئەبی زەڕقاء دەفەرمووێ : سوفیانی سەوری هاتە دەرەوە لەماڵەکەی خۆی ئێمەش لەبەردەم دەرگای ماڵەکەی وەستا بووین : فەرمووی ( ئەی کۆمەڵی گەنجان پەلەبکەن لەبەدەست هێنانی بەرەکەتی ئەو زانستە شەرعیە بەڕاستی ئێوە نازانن لەوانەیە نەگەن بەو شتەی کەلەفکری خۆتان داتان ناوە لەزانستی شەرعی ، تاوەکوو هەندێکتان سوود و قازانج بە هەندێکتان بگەیەنن )[٦].

مەبەستی لە ( پەلەکردن لەبەدەست هێنانی بەرەکەتی ئەم زانستە شەرعیە ) واتە ؛ قۆناغی گەنجیتان بەهەڵ بقۆزنەوە لە بەدەست هێنانی زانستی شەرعی ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر کەوتە ناو تەمەن ئەو چالاکی و بیرتیژی و توانا بیرکردنەوەی نامێنێ هاو شـــێوەی ئەوەی لـــە قۆناغی گەنجیەتی دا هەیبوو زیـــاد لـــەوەش

[٦] - أخرَجَهُ أَبُو نُعَيمٍ في كِتابِهِ (حِلْيَةُ الأَوْلياء) (٦/٣٧٠).





بەرپرسیاریەتی ماڵ و منداڵ و  ئیش و کاری دەکەوێتە سەرشان و سەرقاڵ و خەریکی بەرژەوەندیەکانی خۆی دەبێ ، لەکاتێکدا گەنج ئەو جۆرە شتانەی لەسەر نیە ، هەروەها قۆناغی گەنجی زۆر بەخێرای دەڕوات ، هەروەک چۆن ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : (من گەنجم نەچوواندوە بەشتێک نەبێ کەلەگیرفانم  بووە و کەوتۆتە خوارەوە )[٧].

سوفیانی سەوری کەدەڵێ : ( بەڕاستی ئێوە نازانن لەوانەیە نەگەن بەو شتەی کە لەبیرو فکری خۆتان داتان ناوە ) ؛ واتە گەنج لەفکری خۆی دایناوە لەداهاتوودا ئەوەندە زانستە شەرعیە بەدەست بێنێ  و ئەوەندە مەتن و فەرموودەیە لەبەرکات ، و فڵانە و فڵانە کتێب بخوێنێتەوە ، جگەلەمانەش زۆر شتی تریش کەلە فکری خۆیدا دایناوە  پێ یان ناگات ، بەڵام ئەگەر تێکۆشا لەگەڵ نەفسی خۆی ، و پشتی بەخوا بەست ، و سوور بوو لەسەر قۆزتنەوەی قۆناغی گەنجیەتی ؛ ئەوکات بەویستی خوا گەورە خێرێکی گەورەی بەدەست دێنێ ، خوای گەورە دەفەرمووێ : { وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ }[سُورَةُ العَنكَبُوتِ ٦٩]  .

---

[٧] - ذَكَرَهُ الحافِظُ الذَهَبِي في (سِيرَ أَعلامُ النُبَلاء) (٣٠٥/١١).







واتە : ( کەسانێك کە لە پێناو ڕەزامەندی ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە بەڕاستی ڕێنموونیان دەکەین بۆ ڕێگا چاکەکانی خۆمان وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکەکاراندایە ) .

وە کەدەڵێ : ( تاوەکوو هەندێکتان سوود بەهەندێکتان بگەیەنن ) هانی گەنجان دەدا تاوەکوو بەیەک گەیشتن و کۆبوونەوەکانیان لەگەڵ یەکتری هەڵ بقۆزنەوە بەوەی سوود وکەڵک بەیەک بگەیەنن و ئەو زانستە شەرعیانەی خوێندوویانە بەچاکی بەبیری یەکتری بێننەوە .





# ئامۆژگاری پێنجەم

لــە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

لەحەسەنی بەصریەوە هاتووە کەوا زۆرجار دەیفەرموو : ( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، دەســـت بگــرن بەڕۆژی دواییەوە و داوای بکەن (( داوای بەهەشت بکەن )) ، زۆرمان بینی لەو کەسانەی کەوا داوای ڕۆژی دواییان کرد لەگەڵ ڕۆژی دوایی بە دونیاش گەیشتن ، کەسێکمان نەبینی داوای ژیانی دونیای کردبێ لەگەڵ ژیانی دونیا بەڕۆژی دوایش گەیشتبێ )[٨].

ئەوە ئاگادارکردنەوەیەکی زۆر گەورەیە لەلایەن حەسەنی بەصریەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ بۆ گەنج ، تاوەکوو خەم و مەبەستی هەرە گەورەی ژیانی دوا ڕۆژ و قەبر و قیامەت بێ ، و گرنگی بدا بەبەدەست هێنانی ژیانی دوا ڕۆژ ، و کاتەکانی بەو شتانە بەسەر ببات کـــەوا لەخوای پەروەردگاری نزیک دەکەنەوە ، ئەگەر وای کرد

[٨] - أَخرَجَهُ البَيهَقِيُّ في (كِتابِ الزُّهْد) برقم (١٢).







بەڕاستی خوای گەورە منەتی لەسەر دەکات بەوەی بەشی خۆی لەدونیاش پێ دەبەخشێ . ئەو قسەی حەسەنی بەصری ئەوەی لێ ناخوێندرێتەوە کەوا مرۆڤ واز لەبەدەست هێنانی ئەو شتانە بێنێ کەوا ژیانی دونیای لەسەر وەستاوە ، و واز لەبەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزی و خانوو و جل و بەرگ بێنێ ، و بە مشەخۆری بمێنێتەوە لەسەر خەڵکانی تر ، بەڵکوو کارکردن و هەوڵدان و بەدەست هێنانی پارە -- هەرچەندە دەوڵەمەندیش بێ -- زیان لەموسڵمان نادات ، بەڵکوو ئەوەی زیان لەموسڵمان دەدا ئەوەیە کەوا خەم و تاکە مەبەستی تەنها بیرکردنەوە بێ لەدونیا ، بەجۆرێک ژیانی دوا ڕۆژ لەیاد بکات ، هەروەک لەپێغەمبەری خواوە هاتووە صلى الله عليه و سلم کەوا لەدوعانی دا دەیفەرموو :

(اللَّهمَّ لا تَجْعَلِ الدُّنْيا أَكْبرَ هَمِّنا وَلا مَبْلغَ عِلمِنا )[٩].

واتە : ( خوایە دونیا نەکەیە گەورەترین خەممان ، و نەبێتە ئەوەی هەموو زانست و زانیاریمان بیرکردنەوە بێ لەدونیا ) .

هەروەها دەفەرمووێ : ( إِنَّكَ إِنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ إِنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ )[١٠]

---

٩ - أخرَجَهُ الترمُذِي في (الجامِع) أبواب : الدَعوات، رَقم: (٣٥٠٢)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (الكَلِمُ الطَيب) برقم (٢٢٦).

١٠ - أخرَجَهُ البُخاري في (صَحِيحِهِ) برقم (١٢٩٥) ومُسلِمْ في (صَحِيحِهِ) برقم: (١٦٢٨).





واتە : ( ئەگەر لەدوای خۆت میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵی باشترە لەوەی بەهەژاریان بەجێ بێڵی و دەست لەخەڵک پانکەوە ) .

هەرکەسێک دوارۆژ خەم و مەبەستی هەرە گەورەی بێ ؛ خوای گەورە دونیا و دوارۆژی بۆ کۆ دەکاتەوە ؛ دونیا بەرەو پیلی دێ بە ملکەچی و کزۆڵی ؛ بەڵام هەرکەسێک دونیا ئەوپەڕی خەم و مەبەستی بێ ؛ خوای گەورە هەژاری لەنێوچاوانی دەنووسێ ، هەر ئەوەندەی لەدونیا بۆ دێ کەخوای گەورە بۆی نووسیووە .





# ئامۆژگاری شەشەم

لــە ئامۆژگاریەکانی پێشینانی چاک بۆ گەنجان :

لەعوقبەی کوڕی باوکی حەکیمەوە دەفەرمووێ لەلای عەونی کوڕی عەبدوڵا دانیشتبووین بەئێمەی دەوت : ( کۆمەڵی گەنجان ؛ بێگومان ئێمە بینیمان وا گەنجانێک دەمرن ، ئەگەر داس بگات بەدانەوێڵەیەکی پێ گەیشتوو چاوەڕوانی چی لەو دانەوێڵەیە دەکرێ ! )[11] ( دەستی لەڕیشی دەدا کاتێ ئەو قسانەی دەکرد )[12].

مەبەستی ئەوەیە ئەوەی گەیشتە قۆناغی گەنجێتی کاتی ئەوەی هاتووە داس هەڵگرێ و خەریکی دروێنەکردنی کار و کردەوەی چاک بێ ؛ چونکە بەرووبووم ئەگەر پێگەیشت کاتی دروێنە دادێ ، هەروەها ئەوکەسەشی بچێتە ناو تەمەنەوە کاتی مردنی نزیک بوویتەوە ، بۆیە باسی ئەوەی بۆ کردن تاوەکوو ئاگاداریان بکاتەوە کەوامرۆڤ نابێ هــەڵ بخەڵەتێ کاتێک کەسیکێ بەتەمــەن دەبینێ

---

[11] - **المِنْجَلُ** : ئامێرێکی دەستیە لەدروێنەکردنی دانەوێڵە بەکاردێ.

[12] - أَخرَجَهُ ابْن أَبي الدُّونيا في كِتابِهِ (**العُمْرُ والشَّيْب**) برقم (٤٢).




لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵک کاتێک کەسانی بەتەمەن دەبینن خۆیان هەڵ دەخەڵەتێن و واگومان دەبەن کەوا ئەوانیش دەگەنە ئەو تەمەنە ؛ بۆیە کەمتەرخەمی دەکەن لەئەنجام دانی کاری چاکە و کارەکانیان دوا دەخەن و ئەورۆ سبەی لێ دەکەن .

هەروەک وتراوە :

یەک کەس دەکەوێتە ناو تەمەنەوە گەلێک فریوو دەخوا

لەبیریان کردووە ئەوەی دەمرێ هەر لەگەنجانە

بەهەمان ئەو مانایایە لەحەسەنی بەصریەوە هاتووە کەوا ڕۆژێکیان بەو کەسانەی لەمەجلیسەکەی دانیشتوون _ پیر و گەنجیان تیا بووە _ فەرمووە : ( ئەی کۆمەڵی پیران دانەوێڵە چی لێ چاوەڕێی دەکرێت ئەگەر پێگەیشت ؟ فەرموویان : دروێنەوە ، فەرمووی : ئەی کۆمەڵی گەنجان : بەڕاستی دانەوێڵە پێش ئەوەی پێ ڕابگات ڕەنگە تووشی ئافات و لەناوچوون بێت )[١٣].

پێویستە لەسەر موسڵمان بارودۆخ و گوزەرانی بەو شێوەیە بێ کەلەفەرموودەدا هاتووە : ( إذَا أمْسَيْتَ فلا تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وإذَا أصْبَحْتَ فلا تَنْتَظِرِ المَسَاءَ )[١٤].

---

١٣ - أَخرَجَهُ البَيهقِيُّ في (كِتابِ الزُّهدِ) برقم (٥٠٠) .

١٤ - أَخرَجَهُ البُخاري (٦٤١٦) عَن عَبداللّهِ بْنِ عُمر مَوقوفاً عليه.







واتە : ( کەئێوارەت کردەوە چاوەڕێ ی گەیشتن بە بەیانی مەکە ، وە ئەگەر بەیانیشت کردەوە چاوەڕێ ی گەیشتن بەئێوارە مەکە ) .

ئیبن ئەل جەوزی دەفەرمووێ : ( پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کەوا نازانێ مردن کەی یەخەی پێ دەگرێ ، ئامادەبێ بۆ مردن ، بەگەنجیەتی و لەش ساغیەکەی هەڵ نەخەڵەتێ وا بزانێ مادام گەنجە و لەشی ساغە جارێ نامرێت ، چونکە بەڕاستی کەمترینی ئەوانەی کەدەمرن لە پیرەکانن ، و زۆرینەی ئەوانەی کەدەمرن گەنج و لاوەکانن ، لەبەرئەوە دەگمەنە کەسێک تەمەنێکی دوور و درێژ بژیێ ئینجا بەپیری بمرێ )[١٥].

کاتێک کەسەیری خێزانەکان بکەی دەبینی بەساڵاچووانی کەم تێدایە و زۆربەی ئەوەی دەمرێ لەتەمەنی گەنجی و منداڵیدا دەمرن و ناگەنە تەمەنی پیری .

[١٥] - (صَيدُ الخاطِر) (ص٢٤٠) .





# ئامۆژگاری حەوتەم

لــە ئامۆژگاریەکانی پێشینانی چاک بۆ گەنجان :

قابووسی کوڕی باوکی ظەبیان دەڵێ : ( ڕۆژێکیان نوێژمان لەدوای باوکی ظەبیان کرد ، یەکەمجار بوو نوێژی لەدواوەبکەین ، ئێمە هەموومان گەنجی یەک گەڕەک بووین تەنها بانگ بێژەکە نەبێ بەتەمەن بوو ، کاتێک سەلامی دایەوە ئاوڕی لێمان دایەوە ، و پاشان دانە بەدانە پرسیاری لەگەنجەکان دەکرد : تۆ کێ ی ؟ تۆ کێ ی ؟ کاتێک پرسیاری لێ دەکردن ؛ بۆئەوەی هانیان بدات و چوست و چاڵاکیان بکات ، دەیفەرموو بەڕاستی هیچ پێغەمبەرێک نەنێردراوە مەگەر گەنج نەبووبێ ، هیچ زانستێکیش بەکەس نەبەخشراوە مەگەر گەنج نەبووبێ )[١٦].

ئاگاداری کردنەوە لەسەر بەهەڵ قۆزتنەوەی خێر و بەرەکەتی تەمەنی گەنجیەتی ؛ وە ئەو تەمەنە هەلێکی گەورەیە بۆ بەدەست هێنانی زانستی شەرعی ، و قۆزتنەوەی ئەو چالاکی و هێز وتوانایەی لەو تەمەنەدا هەیە .

---

[١٦] - أخرَجَهُ أبو خَيثَمَةَ في (كِتابِ العِلْمِ) برقم (٨٠).





# ئامۆژگاری هەشتەم

ئیمامی ئەحمەد لەکتێبی (الوَرع) دا لەعەبدول وەهابی ثەقەفی یەوە هێناویەتی کەوا فەرموویەتی : ئەیوبی سەختیانی هات بۆ لامان : (فەرمووی ئەی کۆمەڵی گەنجان ؛ ئیش و پیشەیەکی تایبەت بەخۆتان هەبێ ، پێویستان بەوە نابێ بێنە بەردەرگای ئەو جۆرە کەسانە و داوای پارە و یارمەتیان لێ بکەن ) پاشان باسی ئەو کەسانەی کرد کەبەدڵی نەبوون[١٧].

واتە پێویستە گەنج لەگەڵ بەدەست هێنانی زانستی شەرعی کارو پیشەیەکی هەبێ تابەهۆیەوە بتوانێ پارە پەیدابکات و لەسەر خۆیی و خێزان و منداڵەکانی سەرفی کات ، وتاوەکوو نەبێتە مشەخۆر و لەسەر گیرفانی خەڵکی بژی و دەست لەخەڵک پانکاتەوە ؛ و کاتێکیش کە کەوتە ناو تەمەن پێوێستی بەوە نەبێ بچێتە بەردەرگای فڵان و فڵان و دەست پانکاتەوە و داوای کۆمەک و یارمەتیان لێ بکات ، بە (بَرَكَة) ترین و چاکترین ڕزق و ڕۆزی ئەوەیە کەوا بەدەست و بازوو و ڕەنجی سەر شانی خۆت پەیدای بکەی .

---

١٧ - كِتاب (الوَرع) ، رَقم (٩٤).







# ئامۆژگاری نۆیەم

لــە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

لەجەعغەرەوە هاتووە فەرموویەتی دانیشتبووین ڕووە و قیبلە ، سابتی کوڕی ئەلبونانی هاتەلامان فەرمووی : ( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، بوونە بەربەست و لەمپەر لەنێوان من و پەروەردگارم تانوێژەکەم بەجوانی و خوشوعەوە بکەم ) ، خۆشەویست ترین شت لای ئەو نوێژ بوو[١٨].

ئاماژە بەوەدەکات کەوا هەندێ گەنج کاتێک لەمزگەوت بەیەکەوە کۆدەبنەوە ، هەڵ و مەرجی بەیەک گەیشتنیان بەهاوڕێ کانیان لەمزگەوت بەهەڵ دەقۆزنەوە بەوەی خۆیان بەقسەی ئەم لاو ئەم لا خەریک دەکەن و یادی خوا ناکەن ، ڕەنگە خەڵکێک لەتەنیشتیان بێ هاتبێتە مزگەوت بۆئەوەی خوا پەرستی بکات ، و بەئارامی و بەملکەچیەوە نوێژەکانی بکات ؛ بەو هۆیەوە دەبنە ڕێگر لەوەی نوێژەکەی بەجوانی و ملکەچیەوە بکات ، نەخۆیان بەخوا پەرستی و یادی خوا سەرقاڵ دەکەن لەمزگەوت ، نە وازیش لەو کەسە دێنن کەهاتووە لە مزگەوت خوا پەرستی بکات و سەرقاڵی پەرستن بێت .

[١٨] - رَواهُ أبونُعَيْمِ في (حِليَةُ الأولياء) (٣٢٢/٢).







لەبەرئەوە ؛ لەوشتانەی کەوا پێویستە گەنج ئاگاداری بێ ، بریتیەلە لەبەرچاوگرتنی رێز و شکۆی مزگەوت و پێگەی خەڵکی مزگەوت ؛ نەبادا خەڵکی مزگەوت سەرقاڵ کەن بەشتانێکی دەرەکی و دوور لەخواپەرستی یەوە و دوریان خەنەوە لە خشوع و ملکەچی ناو نوێژ .

هەر مەشپرسە لەشتە تازەگەرییەکانی ئەو سەردەمەش لە هۆکارەکانی پەیوەندی کردن (مۆبایل) ، کەوا گەنج لەگیرفانی هەڵی دەگرێت ، و رەنگە زەنگی موبایلەکەی یان بەوەڵام دانەوەی پەیوەندی یان هاوشێوەی ئەو جۆرە شتانەی کەوا دەنگە دەنگ بۆ خەڵک دروست دەکەن خەڵک سەرقاڵ بکەن لەنوێژەکانیان و ئارامی و خشوعیان نەهێڵن .







# ئامۆژگاری دەیەم

یەکێک لـــە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

پێمان گەیشتووە لە محمدی کوڕی سوقەوە فەرموویەتی :

(مەیمونی کوڕی میهران تووشم بوو پێم وت : حیاك اللّه ( وەك بڵێ ی هەربژی یان هەربمێنی یان تەمەن درێژ بی ) وتی : ئەوە سڵاوی گەنجانەیە ، بەسەلام دەست پێ بکە واتە بڵێ : السلام علیکم ورحمة اللّه وبرکاته )[19].

لە فەرموودەدا هاتووە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه و سلم دەفەرمووێ:

( مَنْ بَدَأَ بِالكلامِ قَبْلَ السَلامِ ، فلَا تُجِيبوهُ )[20].

واتە : ( هەرکەسێک دەست بەقسەکردن بکات پێش سەلام کردن ، وەڵامی قسەکانی مەدەنەوە ) .

---

[19] - أخرَجَهُ أبُو نُعَيمٍ في (الحِليَة) (٨٦/٤).

[20] - أَخرَجَهُ ابْن السُّنّي في (عَمل اليَومِ و اللَّيلَة) بِرقَم : (٢١٤) وانْظُر (الصَحيحَة) (٨١٦).







ڕەحمەتی خوای لێ بی کەدەڵێ ( ئەوە سڵاوی گەنجانە ) ؛ بەڕاستی هەندێک لەگەنجان دڵ خۆش دەبن بەجۆرێک لەسڵاوکردن ؛ وای دەبینن ئەوە جوانترین سڵاوە ؛ واز لە ( السَّلامُ عَلیْکُم ) دەهێنێ و ، بەهەندێ سڵاو دەست پێدەکات کەخۆی ئارەزووی لێ یە و دڵی بەلایدا دەچێت ، ڕەنگیشە هەر لەکورتی بیبڕنەوە و تەنها سڵاو بکەن و (السَّلامُ عَلیْکُم ) نەکەن ، وە لەوانەشە دوای سڵاوکردن ئینجا ( السَّلامُ عَلیْکُم) بکات .







# ئامۆژگاری یازدەهەم

لــە ئامۆژگاریەکانی پێشینان بۆ گەنجان :

پێمان گەیشتووە لەباوکی مەلیح دەڵێ : لەدەوری مەیموونی کوڕی میهران دانیشتبووین و پێ وتین : ( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، هێز و تواناتان بخەنە خزمەتی تەمەنی گەنجیەتیتان و لەگوێڕایەڵی خوای گەورە بەکاری بهێنن ، وە چووست و چالاکیتان بخەنە خزمەتی گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە ، ئێوەش ئەی کۆمەڵی بەساڵاچووان ؛ هەتا کەی ؟ )[٢١].

ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئامۆژگاری کردن بەقۆزتنەوەی هێز و چالاکی گەنجایەتیان لەگوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە و لەهەرشتێک کەلەخوای گەورەیان نزیکیان دەکاتەوە .

پاشان فەرمووی : ( ئەی کۆمەڵی پیران ؛ هەتا کەی ؟ ) ، واتە : ئەی گرۆی بەساڵاچووان هەتاکەی چاوەڕێ دەکەن ، و ئەوەندە تەمەنەی ماوتانە نایقۆزنەوە لەخوا پەرستی و لەگوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە ؟

---

[٢١] - أخرَجَهُ أبُونُعَيمٍ في (الحِليَة) (٨٧/٤).






# ئامۆژگاری دوازدەم

پێمان گەیشتووە لـــە ئیمامی فریابی کەوا فەرموویەتی : ( سوفیانی ثەوری نوێژی دەکرد پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلای گەنجان و فەرمووی : ئەی گەنجەکان ئەگەر ئەمڕۆ نوێژ نەکەن ئەی کەی نوێژ دەکەن ؟ )[٢٢].

سوفیانی ثەوری ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئامۆژگاری گەنجان دەکات ، بەئامۆژگاریەکی گەورە و گرنگ بەوەی قۆناغی گەنجیەتیان هەڵ بقۆزنەوە لەگوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە ، گەنج ئەگەر قۆناغی گەنجیەتی نەقۆزێتەوە لە سوژدە بردن بۆ خوای گەورە بەدڵنیاییەوە ڕۆژێک دادێ دەکەوێتە ناو تەمەنەوە و لاواز دەبێ و دەچێتە ناو قۆناغێک لەقۆناغەکانی ژیانی کەوا خۆزگە دەخوازێ سوژدەی تێدابات بۆ خوای گەورە بەڵام ناتوانێت ؛ بەهۆی بێ توانای و نەخۆشی جەستەی توانای سوژدە بردنی نامێنێ ، هەر لەبەرئەوە پێ فەرموون ( ئەگەر ئەمڕۆ نوێژ نەکەن ئەی کەی نوێژ دەکەن ؟ ) .

---

[٢٢] - أَخرَجَهُ أَبُونُعَيمٍ في (الحِليَة) (٧/٥٩).







# ئامۆژگاری سیانزەم

لــە ڕەبیعەی کوڕی کولثومەوە هــاتووە کەوا فەرموویەتی :
ئێمە گەنج بووین لەدەوری حەسەنی بەصڕی دانیشتبووین ، ڕووی لێ کردین و فەرمووی : ( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، ئایا تامەزرۆی گەیشتن بەحۆری عەین نین ؟ ).[23]

ئەوە ئاوڕدانەوەیەکی جوان بووە لەلایەن ئیمامی حەسەنی بەصریەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ تا بەهۆیەوە نازوو نیعمەتەکانی بەهەشت ، و ئەوەی تیایدایە لەچێژوو و خۆشی ، و حۆری عەین بەبیری ئەو گەنجانە بێنێتەوە ، تاوەکوو چوست و چالاک بن و حەزوو ئارەزوویان بۆ چوونە بەهەشت و نازوو نیعمەتەکانی نوێ ببێتەوە ، ئەگەر ئەو حەزە لە دڵیان چەسپا ، ئەوکات هانیان دەدا تاوەکوو کۆشش بکەن و خۆیان ماندوو بکەن بۆ ئەنجامدانی کاروو کردەوەی دوا ڕۆژ و هەوڵی بۆ بدەن .

---

[23] - أخرَجَهُ إبنُ أَبي الدُنيا في كِتابِهِ (صِفَةُ الجَنَّة) رقم (٣١٢).



خوای گەورە دەفەرمووێ :

( وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ) [سُورَةُ الإِسۡرَاءِ: ١٩] .

واتە : ( هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بووبێت وە هەوڵی بۆ بدات و باوەڕداریش بێت ئا ئەوانە کردەوە و تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە و لای پەروەردگاریان پاداشت دەدرێنەوە ) .







# ئامۆژگاری چواردەم

لەحەسەنی بەصریەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ هاتووە فەرموویەتی:

( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، ئاممان وریای دواخستنی کارەکانتان بن بۆ داهاتوو : مەڵێن لەداهاتوودا دەیکەم ، لەداهاتوودا دەیکەم )[٢٤].

وتەکەی ( ئاممان وریای دواخستنی کارەکانتان بن بۆ داهاتوو ) لەداهاتوودا دەیکەم و ئەوڕۆ سبەی کردن دەردێکە زۆربەی گەنجانی تووشی تیاچوون کردووە ، وەک هەندێکیان دەڵێن ( لەداهاتوودا تەوبە دەکەم ، و لەداهاتوودا پارێزگاری لەنوێژەکانم دەکەم ، و لەداهاتوودا لەگەڵ دایک و باوکم چاک دەبم . .... ) ، کەچی نە تەوبە دەکات و نەنوێژەکانی دەکا و نە لەگەڵ دایک و باوکیشی چاک دەبێ و پەلەش ناکا و کاتەکانیشی هەڵ ناقۆزێتەوە ؛ بەڵکوو هەر دەڵێ لەداهاتوودا دەیکەم و ئەوڕۆ سبەی لەئیشەکانی دەکا ، خۆ ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەیی و پێ ی بڵێ ی بگەڕێوە بۆلای خوای گەورە و نوێژەکانت بکە ، و جگە لــەوانە شــتی تـریشی پێ بڵێ ی ، یەکسەر

---

[٢٤] - أَخرَجَهُ إبنُ أَبي الدُنْيا في كِتابِهِ ((قِصَر الأَمل)) برقم (٢١٢).





نەخۆشی لەداهاتوودا دەیکەم یەخەی دەگرێ و دووری دەخاتەوە لەو خێرە .

بەردەوام خەریکی ئەورِۆ سبەی کردن و لەداهاتوودا دەیکەمە هەتاوەکوو بەرەکەتی تەمەنی گەنجیەتی لەدەست دەچێت و فریا ناکەوێ کاتەکانی هەڵ بقۆزێتەوە لەخێر و چاکە ، رِەنگیشە هەندێکیان تەوبەکردن دوابخەن تاوەکوو بگەنە تەمەنێکی دیاری کراو لەژیانیان ؛ کەچی پێش ئەوەی بگەنە ئەو تەمەنەی دیاریان کردووە مردن بەرِۆکیان بگرێ و فریای تەوبەکردن نەکەون .





# ئامۆژگاری یازدەم

لـــــە حەفصەی کچی سیرینەوە هاتووە فەرموویەتی :

( ئەی کۆمەڵی گەنجان ، سوود لەو هێز و توانا و زیرەکیەی لەلاشەتان دایە وەرگرن لەکاتێکدا گەنجن ؛ سوێند بەخوا بەڕاستی نەم بینیووە چاکترین کاتێک کەوا کردەوەی چاکی تێدا ئەنجام بدرێ مەگەر لەگەنجێتی دا بێ )[٢٥].

بەڕاستی قۆناغی گەنجی لەگرینگترین ئەو قۆناغانەیە کەوا پڕە لەخێر و بەرەکەت ئەگەر گەنج بۆی برەخسێ بیقۆزێتەوە پاش ڕازەمەندی خوا ، بەڵام ئەگەر پشتی کرد لەم قۆناغە ، و کاتەکانی تەمەنی گەنجی بەفیرۆدا و شوێنی ئارەزوو و نەفسی کەوت ، بەتایبەتی حەرام کراوەکانی ( زینا و ئارەق و جگەرە . .... هتد ) و زۆر لای شتێکی جوان و باش بوو ؛ بێگومان تاوانی بەرامبەر تەمەنی گەنجی و داهاتووی خۆیی کردووە .

[٢٥] - أَخرَجَهُ المَروَزي في (مُختَصَرْ قِيامُ اللَّيل) (ص : ٤٩).

هەروەک دەڵێن وتوویانە:

**مەرام و مەبەستێکی پیس ئـــەگەر بۆ خاوەنەکەی چێژوو خۆشی بووبێ لەگەنجی**

**لـــــــــە پیریـــــــــــدا بـــــۆیی دەبێتە ســــــــــــزا و تـــاڵـــــی**

مەرام و مەبەستێکی پیس ئەگەر لەتەمەنی گەنجی دا خاوەنەکەی وای ببینێ چێژوو حەزوو خۆشیە ، کاتێک کە دەچێتە ناو تەمەن و پیر دەبێ بۆی دەبێتە سزا و قورِ بەسەری ، وە بەهۆیەوە دوارِۆژێکی خراپی دەبێ .

وتەکەی ( واللّٰه ئەنجام دانی کردەوەی چاکم نەبینیووە تەنها لەتەمەنی گەنجی نەبێ ) .

گەنجێتی قۆناغێکی زۆر گەورەیە لەژیانی مرۆڤ ، پێویستە لەسەری بەچاکی بیقۆزێتەوە ، وە تێکۆشان بکات لەگەڵ نەفسی تێکۆشانێکی تەواو تاوەکوو خێر و بەرەکەتی ئەو قۆناغەی لەکیس نەچێ ، پشت بەخوا ببەستێ ، داوای یارمەتی و پشتیوانی لەخوای گەورە بکا ، بەبیری خۆی بێنێتەوە کەوا ئەو رِۆژەی دەگات بەخوای گەورە پرسیاری لێدەکات دەربارەی ئەو قۆناغە پرسیار گەلێکی زۆر .

وصَلى الله على محمد و على آلهِ وأَصحابِهِ أَجمَعين



عبد الرزاق بن عبد المحسن البدر

# من وصايا السلف للشباب

بەکوردی

شێخ کوڕی گەورە فەرموودەناسی سەردەم (عبدالمحسن البدر )ـە لە (22/11/1382) لە(الزلفی) لە شاری مەدینەی پیرۆز لە دایك بووە، دکتۆرای لە (الإیمان)هەیە ،ئەندامی دەستەی (التدریس)ـە لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی پیرۆز، و ئێستا مامۆستای خوێندنی باڵایە لە بەشی(التجلید) لە زانکۆی ئیسلامی، بڵاوکراوەی زۆرن لەوانە (الحجاج و ارقیة النفوس) (حکم أدعیة و ذکریات) (شرح الکلمات الرقیقة)...هتد.